# پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

# وەک ئەوەی بیبینی

وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ


ئامادەکردنی

حەمزە بەرزنجی

# پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم

## وەك ئەوەی ببینی


ئامادەکردنی

حەمزە بەرزنجی

# محمد رسول الله

## پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

## وەک ئەوەی بیبینی

## ئەم پەیامە پێشکەشە بە:

هەموو ئەو کەسانەی بە راستی پێغەمبەری خوایان ﷺ خۆشدەوێت و تامەزرۆن بە دیداری شادبن.

هەموو ئەو گەنج و لاوە دڵ پڕ لە بڕوایانەی کە ئەیانەوێت رەوشتیان محمدی ﷺ بێت و شەو و رۆژ لە خەمی گەیاندن و سەروەری ئیسلامدان.

بە هەموو ئەو پیاو و ئافرەتە بە تەمەنانەی بە بینینی شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خوا ﷺ شادومان و خۆشحاڵن و بەو هیوایەوە منداڵەکانیان گەورە دەکەن کە پەروەردەیان پەروەردەیەکی موسڵمانانە بێت.

http://www.facebook.com/hamzabarzngy



بسم الله الرحمن الرحيم

## دەستپێك

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه.....

ووریابە قەڵەم باسی کەسێکی ئاسایی و سادە نی یە، باسی ناودارێك نی یە تەنها لە سەردەمێکدا ڕۆڵی بینێبێت و چوبێتە ناو پەڕی لێکۆڵینەوە و تەنها بە تیۆری بخوێنرێت، زۆر ووریابە باسی سەرووەری مرۆڤایەتی یە، باسی ئەو کەسەیە کە سەرمەشقی شوێنکەوتنە لە دین و دونیادا، ئەو پێشەوایەی کە خوای گەورە لە ناو گرۆی بەشەری دا هەڵی بژاردو کردی یە فریادرەس بۆ مرۆڤایەتی، باسی ئەو پێغەمبەرەیە ﴿ﷺ﴾ کە هەتا دونیا بمێنێت بەرنامەکەی بە وێنەی چیمەنی سەوز پەل دەهاوێت و سەراپای زەمین دە کاتە مێرگ و چراخان و سەرەنجامیش سەرووەری بۆ بەرنامەکەی ئەوە. ئەو پیاوەی بە باسکردن و ناو هێنانی ڕەنگ زەرد هەڵدە گەڕێت و وەك دەریای بێ پایان نازانی لە کام ڕۆخی یەوە ئاوی لێ هەڵبگۆزیت: لە دیمەن و ڕوخساری نورینی، یان ڕەوشت و ئاکاری شیرینی، یان پەرستش و

خواپەرستی، سەنگینی، ئاسان نی یە نوسینی پێشەکی یەك بۆ وەها کەسایەتی یەك کە سەرداری کوڕانی ئادەم عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ و کۆتای پێغەمبەران بێت.

ئەو پیاوەی نەك تەنها ئادەمی بگرە خۆشەویستی لە ناو دڵ و دەرونی گیانلەبەرو بگرە بێ زمانەکانیشدا ڕە گی داکوتابوو. بنجە دارخوارماکەی مەدینە شایەتە کە دوای ئەوەی مینبەریان بۆ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ درووست کردو ئەو بنجە دارەی بە جێ هێشت و ووتاری لە پاڵدا نەدەداو دەستە پڕ نازو میهرەبانەکەی پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ لێ بڕا، بە وێنەی منداڵ دەستی کردە هەنسك و گریان، بە جۆرێ دەنگی سوتانەوەی سینەی هەموو هاوەڵان بیستیان، تا پێغەمبەری بەرێز ﴿ﷺ﴾ لەسەر مینبەر دابەزی و وەك منداڵێك لە ئامێزی گرت و ئیتر هێدی هێدی ئارام بوویەوە و بێدەنگ بوو...

شێخ حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هۆ کۆمەڵی موسڵمانان بنجە دار خورمایەکی وشك بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و دیداری ئەو دە گری، ئێوە لە پێشترن شەیدای پێغەمبەرەکەتان بن ﴿ﷺ﴾ .

ئەمڕۆش بە هۆی دوور کەوتنەوەمان لە ڕێبازو ڕەوشـــتە جوان و ئـاکـارە بەرزەکانی ئەو پێغەمبەرە خۆشـــەویستە ﴿ﷺ﴾ ، دەبینین کۆمەڵگاکەمان پڕ بووە لە دیاردەی ســـەیرو ســـەمەرەو ســـیمای موسـڵمانێتی و شـوێنکەوتویەتی پێغەمبەرمان﴿ﷺ﴾ پێوە نەماوەو بگرە زۆرجار ئەو دیاردە نوێیەش لەناو کۆمەڵگەکەماندا پەیدا بووە کە دەبینرێت ســـوکایەتی بەرامبەر خودی ئەو کەســـایەتی یە بەرزو بە حورمەتە دە کرێت. ئێمەش مەگەر تەنها لە مانگی ربیع الأول دا بیری پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ و ژیـانـامەو ڕەوشـــتەکـانیمـان بکەوێتەوە. زۆرێکمان خۆمان بە شـوێنکەوتەو قوتابی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دادەنێین بەڵام بێ ئاگاین لە ژیان و سیرەتی، سەراپای ئاکارو ڕەوشتمان بەرائەتی خۆی نیشــان دەدات لەو بانگەشــەیە. واش دەزانین خۆشــەویستی دەربڕین بریتی یە لە گۆرانی ووتن و شــیرینی بەخشــینەوە لە یادی لە دایك بوونی داو بەس....

خوێنەری خۆشـەویست .. ئەم بەرهەمەی بەردەسـتت بریتی یە لە پوختەی سـیفەتی ڕووخسـارو دیمەن و ڕواڵەت و لاشـەی پیرۆزی پێغەمبەرە ڕابەرە کەمان﴿ﷺ﴾ کە زۆرێکمان لێی بێ ئاگاین، پاشانیش مشـــتێکە لە خەرواری ڕەوشـــت و ئـاکـارو ڕەفتـارە بۆن خۆش و

ڕەونەقدارەکانی کە دۆست و دوژمنی شایەتی بە هەقی بۆ دەدەن. کە لەبەر درێژ نەبوونی باســەکەمان بەڵگەو فەرموودەکانمان نەهێناوە، کە سەرجەم بەڵگەکان فەرموودەی (صَحیح) یان (حَسَن)ن، وە بۆ زیاتر ئاگادار بوون پێی ئەتوانن تەماشای کتێبی (ڕووخسارو ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ) بکەن.

لە خوای گەورە داواکـارین بە شـــوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە خۆشـــەویستە ﴿ﷺ﴾قبوڵمان بکات و لە ڕۆژی قیامەتدا بە دیداری شادمان بکات.





## لە دایك بوون و ناو و نەژادی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾



پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی ربیع الأول دا لە دایك بووە لە شاری مەككەی پیرۆز و لە ماڵێكدا كە ناسراوە بە (دارالمولد) واتە: خانەی لەدایك بوون، لە ساڵی ناسراو بە ساڵی (فیل) كە دەكاتە (٥٧١)ی زاینی، لە دایك و باوكێكی ناسراو: باوكی ناوی عبداللە ی كوڕی عبدالمطلبە ودایكی ناوی ئامینەی كچی وەهبە، باپیری ناوی نا محمد ﴿ﷺ﴾. وە باوكی پێش لەدایك بوونی ئەم وەفاتی كرد .

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەبەر سیفەتە جوانەكانی سوپاس كراو بووە لە ڕەچەڵەكی یەوە بەپاكی و بێ لەكەیی هاتووە و خوای گەورە هەڵی بژاردووە، ناوە جوانەكانی زۆرە لەوانە : (محمد – أحمد – الماحی – الحاشر –العاقب) وە (نَبيُّ الرَّحمة - نَبيُّ التَّوبة –المُقَفي – نَبيُّ المَلاحِم) لە ئینجیلدا بە (أحمد) و لە تەوراتا ناوی بە (المتوكل) هاتووە، وە خوای گەورە وەسفی كردووە بە (رؤوف) و (رحیم).




نـاوی تەواوی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەم جۆرەیە [محمـدی کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشـم کوڕی عبد مناف کوڕی قصـــــي کوڕی كلاب کوڕی مرة کوڕی كعب کوڕی لؤی کوڕی غالب کوڕی فهر کوڕی مالك کوڕی النــضـــر کوڕی كنانة کوڕی خُزيمة کوڕی مدركة کوڕی إلياس کوڕی مُضـــر کوڕی نذار کوڕی مەعد کوڕی عدنان] کە تا ئێرە بە ڕاستی وصەحیحی هاتووە و لەسـەرو ئەمیشـەوە ئیختیلافی تێدایە . بەڵام گومانی تێدا نی یە کە عەدنان لە نەوەو کوڕانی اسماعیل پێغەمبەرە عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ.

(بڕوانە الرحيق المختوم لا ٤٧ و مختصــــــــــر سِـــيرة الرســول، محمد بن عبدالوهاب).





## لە فەزڵەکانی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەدەرو ئاگادارکەرەوەو ترسێنەرو چرایەکی ڕۆشنە، پێغەمبەری خواو کۆتای پێغەمبەرانە، زۆرترین شوێن کەوتەی هەیە لە ڕۆژی دوایی داو یەکەم کەسە کە لە رۆژی دوایی دا لە دەرگای بەهەشت دەدات، یەکەم تکاکارە لە بەهەشتدا، چاوی دەنوست بەڵام دڵی نەدەنوست، لە کاتی نوێژدا لە پشتیشی یەوە خەڵکی دەبینی هەروەك لەبەردەمیدا بێت، سەرداری کوڕانی ئادەمەو یەکەم کەسە زەوی بۆ لەت دەبێ و زیندوو دەبێتەوەو یەکەم شەفاعەتکارە لە مەحشەردا. بەسەر پێغەمبەرانی تردا فەزڵ دراوە بە شەش خاسیەت و تایبەتمەندی گرنگ کە بریتی یە لەمانە:( ووتەی گشت گیری کورتی پێدراوە کە وتەیەکی کەمەو مانایەکی زۆری هەیە [ئەگونجێت قورئان بێت یان فەرموودەکانی خۆی بێت واللە أعلم] وە سەرخراوە بەسەر دوژمناندا بە ترس لە مانگە ڕێیەکەوە لێی دەترسان وە غەنیمەتی بۆ حەڵاڵ کراوە، وە هەموو زەویی بۆ کراوە بە شوێن کوڕنوشگاو پاکێتی [بۆ نوێژ کردن و تەیەمموم] وە

نێردراوە بۆ گشـــت دروســـت کراوان، وە بە هاتنی پێغەمبەرایەتی کۆتایی پێ هێنرا) .

وە لە چـاکترین ســـەدەو چـاخـدا نێردراوە، نژاو پـاڕانەوەکـانی گیرابوون، وە تەواوکەری کاری پێغەمبەرایەتی یە.









## دیمەنی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ وەك ئەوەی بیبینی



بـاڵای نەزۆر درێـژ بووە و نەزۆر کورت، ڕەنگیشـی سپی یەکی خوێن ســـارد نەبووەو ئەسمەر ڕەنگیش نەبووە. قژیشی لول نەبووە، سەرو ڕیشی نزیکەی بیست تاڵ موی سپی تێدا نەبووە، ڕەنگی ڕووی گەشـــاوەو ســپی کار بووە دەتوت بەزیو قاڵ دراوە. ڕیشی پیرۆزی پڕبووەو ڕەنگی ڕووی سووری یەکی پێوە دیار بووە. لاشەی مامناوەندو جوان بووە، لە ڕۆیشتندا کەمێك بەرەو پێشـــەوە ڕەوتی دەکرد بە وێنەی کەشتی، چوارشانە بووەو شانەکانی پان و لەیەك دوور بووە و قژی هەتا نەرمایی گوێچکەکانی (یان هەندێك جار تانزیکی ناوشـانی) هاتبوو، پەنجەو لەپی دەستی و هەردووقاچ و سەری پیرۆزو هەروەها ســـەری ئێسقانەکانیشـــی گـــەورە بووە. وە مووی سەرسینگی تا کەلەکەی درێژ بوو بووەوە. دەمی پیرۆزی گەورەو قلێشی چاوەکانی درێژو پاژنەی قاچی کەم گۆشت بووە لە مانگ جوانتر بووە و شێوەی لە ڕۆژو مانگ چووەو شێوەی ڕووی پیرۆزو دەم و چاوی خڕ بووە. وە زۆر لە (ابراهیم) پێغەمبەر عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ چووە.

ئەمەندە خۆشـــەویست بوو جاری وا بووە کافرانیش هۆنراوەیان وتووە بەســـەری دا. دەســـتی لە لۆکە و ئاوریشم نەرمتر بووە و بۆنی ئارەقەی لەشی پیرۆزی لەعەتر و میســك خۆشـتر بووە، دەم و چاوی ڕۆشن و نورانی بووە. نە قەڵەو و نە لاواز بووە، ڕەشایی گلێنەی چاوە جوانەکانی زۆر بووە. برژانگی درێژ بووە. دەنگی خۆش بووەو سـەدای تێـدا بووە، گەردنی بەرز بووە، هەردوو برۆی درێژو چەمـاوە بووەو نزیکبووە بگەن بە یەك، بە هەیبەت و ویقار بووە، قسـەکانی دەتوت مورووی ڕێکخراوە بە دوای یەکدا دێن، ڕووی لە کەس هەڵنەدە کردو قسە بەتاڵ نەبووە،

مۆری پێغەمبەرایەتی بە پشتی پیرۆزی یەوە بووە لە نێوان هەردوو شـــانی دا لە هێلکەی کۆتر چووە، ئەویش پـارچەیەکی ســـوورو بەرزبووەوە بووەو لە لاشەی پیرۆزی چووە، ئەو مۆرە بەلای ناوشانی چەپی یەوە بوو بە ئەندازەی مســتێکی دەســت. خاڵی ڕەش باوی بە دەورەوە بووە، وەکو بـالوکە (ثـآلیـل) وابووە. وە کۆمەڵە موویەکی کۆبووەوەی پێوە بووە.

ئـارەقەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك مرواری وابووە. وە بۆنی خۆشـــتر بووە لە میســـك و عەنبەر، یەکێـك لەئـافرەتە بەڕێزە صـــەحابیەکان (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئارەقەکەی دە گرت لە جێی

گوڵاو بەکاریان دەهێنا. وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ شوشەیەکی هەبوو گوڵاوی تێدابوو بۆ بۆن خۆش کردنی خۆی، وە زۆر حەزی لە بۆنی خۆش دەکرد و ڕەتی نەدەکردەوە فەرمانیشی کردووە کە پشتی وبۆنی خۆش و شیر ڕەت نەکرێتەوە.

قژی نەرم وبەردراوە بووە، سەرەتا بەری دەدایەوەو بۆ خوارەوە دایدەهێنا، بەڵام دوایی بەم لاولای ناوەراستی سەری دا دووبەشی دەکرد وەهەندێ جار عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆی دادەهێنا، حەزی دەکرد بە دەستی ڕاستی و لە لای ڕاستی یەوە قژی دابهێنێت، مووە سپی یەکانی بە زۆری لەلای لاجانەکانی دا بووە، لە سەرو ڕیشی دا نزیکەی چواردە تابیست تاڵی سپی تێدا بووە، بە زۆری لە پێشەوەی ڕیشی دا یان بە بڵاوی لە سەری دا بووەو کە چەوری دەکرد نەدەبینرا. وە فەرموویەتی: سورەتی (هود)و هاووێنەو خوشکەکانی پیریان کردم.وە تاڵە مووەکانیشی سوور بوون چونکە ڕەنگی کردووە بە ڕەنگی سوورو خەنە.

خۆشەویسترین پۆشاك بەلایەوە کراس قەمیص بووە وە کە پۆشاکی نوێی لەبەر دەکرد داوای خێری ئەو پۆشاکەی لە خوای گەورە دەکردو پەنای پێ دەگرت لە خراپەکەی. وە دەیفەرموو پۆشاکی سپی لەبەربکەن. نەجاشی جوتێ خوفی ڕەشی تۆخی بە دیاری

بۆنـاردو ئەویش لە پێی کرد هەروەهـا (دِحیە)ش . وەشـــێوەی نەعلەکەی: دوو(قبال)ی هەبوو{(قِبال) پارچە قەیتانێکە دەچێتە نێوان پەنجە گەورەو ئەوەی پەنای مووی پێوە نەبووەو لە پێســـتە دروست کرابوو.

وە دەیفەرموو: بە یەك تاکەوە مەڕۆن بەڕێدا وە لە کاتی لەپێ کردنی دا ڕاست پێش بخەن و بۆ داکەندنیش چەپ.

مستیلەکەی لە زیوو دروست کرابوو، سەرو نەخشەکەی حەبەشی بوو لە مووروویەکی سپی و ڕەش پێك هاتبوو مۆری نامەکانی پێدە کرد. چونکە لەســـەر نەخشـــەکەی نوسرابوو (محمد رســـول الله). ئەم مســـتیلەیە لە دەســـتیدا بوو تا وەفاتی کرد، دوای خۆی لە دەســـتی ئەبوبەکرو عومەرو عثمان دا بوو (ڕەزای خوایان لێ بێت)، تا ئەوە بوو لە سەردەمی عوثـــماندا (ڕەزای خواي لێ بێت)، کەوتە ناوبیری ئەریسەوە کە بیرێکە لە باخێکی نزیك مزگەوتی (قوباء). بە زۆری لە دەســـتی ڕاســـتی دە کرد، هەندێ جاریش لە دەســـتی چەپی دەنا بەم شـــێوەیە: نەخشـــەکەی دەخســـتە ناولەپی دەســـتی. وەنەهی کردوە لەوەی کەس نەخش بکاتە مســـتیلەکەی. وە ســـەرەتا مســـتیلەیەکی ئاڵتونی هەبوو دوایی لایبردو ئەم دانەیەی کردە دەســـتی کە لە زیوو دروست کرا بوو.

هەندێ جار لە کاتی ووتارداندا مێزەری ڕەشی لەسەر دەکردو لوێچکەی بەناو شانی دا بەر دەدایەوەوە لەو بۆن و عەترەی لێ دەدا کە قژی پێ بۆن خۆش دەکرد، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە وەفاتی کرد کراسێکی پوواو و ڕزیو، لەگەڵ کراس دامێنێکی ئەستووری لەبەردا بووەوە. پۆشاکەکەی تا ناوەڕاستی قاچی پیرۆزی دەهات و دەیفەرموو: پۆشاك مافی نی یە لە خوار قولەپێوە بێتە خوار. پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەندێ جار شانی دادەدایە سەر پشتی یەك لەلای چەپی یەوە.

وە بە ڕاکشاوی یەوە هەرگیز خواردنی نەخواردوە، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بە هەرسێ پەنجەی (گەورەو شایەتمان و ناوەڕاست) خواردنی دەخواردو دوایی پێش ئەوەی دەستی بسڕێت دەیلێسانەوە، هەندێ جار ئەوەندە برسی دەبوو نەیدەتوانی دابنیشێ بە تەواوی و بەپاڵدانەوە بەشتێکەوە خواردنی دەخوارد. وە هەرگیز خێزان وکەس وکاری پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دوو ڕۆژ لەسەر یەك تێریان نەخواردوە لە نانی گەنم و جۆ تا وەفاتی کردوە زۆربەی نانیان نانی جۆ بووەو زۆر ئێوارەش بەبێ شێو سەریان دەنایەوە. وە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەسەر مێز نانی نەخواردوە، بەڵکو لەسەر زەوی دادەنیشت و لەبەردەمی دا هەرگیز زەڵاتەو ووردە شتی لەم بابەتە نەبووە کە

ئارەزووی مرۆڤ زیاد دەکات بۆ خواردن. گۆشتی مریشکی خواردووە، فەرموویەتی: زەیت لە دارێکی پیرۆزە وە لە مزگەوتدا خواردنی خواردووە.

ئەم شتانەی بەلاوە خۆش بووەو حەزی لێ کردووە : سرکە (خەل)، وە کولەکە، حەلْوا، هەنگوین، وە حەزی لە گۆشتی سەر ئێسقانی قۆڵی مەڕومالاّت بوو، وە هەر لەمەشدا بوو لە لایەن جولەکەکانەوە ژەهرخوارد کرا. وە حەزی لە تێوڵە (تريت)و گۆشت کردووە. وە هەندێ جار دەست نوێژی دەگرت دوای خواردنی، وە حەزی لە خورما، وە پاشماوەی کۆتایی خواردنەکەی دەکرد، ئەگەر خواردن نەبوایە بەڕۆژوو دەبوو. جار بووە لە برساندا لە ماڵ هاتۆتە دەرەوەو لە ماڵی هاوەڵەکانی نانی خواردووە، وە دەیفەرموو: لە سەرەتاوە (بسم الله) بکەن ئەگەر بیرتان چوو بڵێن (بسم الله أَوَّلَهُ وآخِرَهُ). وە کە سفرەیان لە بەردەمی دا لادەبرد سوپاس و ستایشی خوای گەورەی دەکرد.

پەرداخی خواردنەوەکەشی لە دارێکی ئەستوور لە داری(النُّضار) دروست کرا بوو بە ئاسن لێوارەکانی تەنرابوو خواردنەوەیان تیایدا دەدایە، وە لە میوەشدا ترۆزی بە خورمای تەڕەوە دەخوارد، وە کاڵەك بە خورمای نەرم و پێگەیشتوو. کە یەکەم نۆبەرەی میوەی

دەبینی دەپاڕایەوەو دەیدا بە بچوکترین منداڵ لەو شوێنەدا. وە هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە. حەزی لە خواردنەوەیەك بووە شـیرین و سـارد بێت. وە فەرموویەتی: جگە لە شـیر هیچ شـتێك جێگەی خواردن و خواردنەوە ناگرێتەوەو بریان ناكەوێت.  هەندێك كات و لە نـاچـاری دا بە پێوەو زۆربەی كـاتیش بە دانیشـتنەوە ئـاوی خـواردوەتەوە. وە لەكـاتی خـواردنەوەی دا سێ جـار لە دەرەوەی كاسەكەدا هەناسەی دەدا .

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ووتەكانی ڕوون و بڕ گە بڕ گە بووە و هەر كەسـێـك بـیـبیستایە لەبەری دەكرد. وە سێ بارەی دەكردەوە تا خەڵكەكە تێی بگات، وە هەموو قسەو ووتەكانی ڕاستی بووە. زۆربەی كاتیش بێدەنگ بووە، بەڵام لە كاتی ووتاردانـدا دەنگی هەڵدەبڕی. وە لەنێوان قسـەكانی دا داوای لێ خۆش بوون (اسـتغفار)ی  دەكرد لە خوای گەورە بەجۆرێ دەیانبیسـت لە مەجلیسـدا سـەد جار دووبارەی دەكردەوە. پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زۆردەم بەخەندە بووەو هەرگیز قـاقـای نەكردووە لە كـاتی پێكەنینـدا، بەڵام هەنـدێ جـار ددانەكانی دواوەی دەركەوتووە لەكاتی پێكەنیندا .

قسـەی خۆش و سـوبعەتی لەگەڵ پیرەژن و منداڵیشـدا دەكرد. بەڵام سوبعەتەكانی دوور بووە لە درۆ. وە سوعبەتی لەگەڵ خەڵكی دا

کردووە. هەندێك جار لە هۆنراوەکانی عبداللهی کوڕی ڕەواحەی دەفەرموو، یان لەوانەی لوبەید. وەهانی شاعیرەکانیشی دەدا بۆ ووتنی شــیعری جوان. وە لە ڕۆژی خەندەقیش دا شــیعری دەوت لەگەڵ هاوەڵەکانیدا تا کەمێك ماندویەتیان بحەســێتەوە. وە کاتێ شــیعری شەرعیان دەوت بێ دەنگ دەبوو.





## نمونەیەك لە ژیان وگوزەرانی پڕ لە سادەیی



پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەسەر حەسیرێك ڕادە کشا جێگەکەی لە لەشی پیرۆزی دا دەردەچوو. وە لە ماڵی دونیا هیچی لەلای خۆی گل نەدەدایەوە. خوای پەروەردگار بێ نیازی کردبوو لە غەیری خۆی، جار بووە مانگ دەڕۆیشت و بگرە دوو مانگ دەگەڕایەوە و ئاگر نەدە کرایەوە لە ماڵی دا، وە زۆربەی خواردنیان ئاوو خورما بووە. جاریش هەبووە خورماشیان دەست نەدەکەوت. زرێکەشی دابوو بە ڕەهن بە جولەکەیەك لە بری قەرزێك. جار بووە بە برسێتی چەندان ڕۆژیان لێ بووەتەوەو زۆربەی نانیان نانی جۆ بووە. وە لەو ڕۆژەوە کە هاتنە شاری مەدینە سێ ڕۆژ لەسەریەك تێریان لە نانی گەنم نەخوارد هەتا وەفاتی کرد. وە دەپاڕایەوە کە خوای گەورە ئەوەندەیان پێ ببەخشێ کە تەنها جێی برسێتی بگرێتەوە، هەرگیز بە چاوی خۆی لە ماڵی خۆیدا نانی گەنمی سپی و مەڕی برژاوی نەبینی هەتا گەیشت بە خوای پەروەردگارو وەفاتی کرد. وە جاری وابووە لە برساندا لەماڵ دەرچووەتە دەرەوە.

پێخەفی نوســتنی پێغەمبەر ﷺ و دۆشــەکەکەی لە چەرم دروست کرابوو ناوەکەی پووشی دارخورما بوو یان لە قوماشـێکی زبر دروســـت کرابوو، دەیفەرموو لە پلەی خۆم زیاد بەرزم مەکەنەوە، لەگەڵ ئافرەتیشــدا دادەنیشــت هەتا پێویستی یەکانی بۆ جێ بەجێ بکات، کە دەعوەت دەکرا دەچوو ئەگەر بانگ هێشــتیش بکرایە بۆ ڕۆنی کۆن بوو. هەندێك جار کراســێکی لەبەر دەکرد چوار درهەمی نەدەکرد. وەحەزی نەدەکرد کەس لەبەری هەســتێت. ئەگەر قۆڵی مەڕێکی بۆ بهێنرایە بەدیاری وەری دەگرت. وە بە پیادەیی دەچوو بۆ سەردانی کردن.

نەهی کردووە لە زۆر ڕابواردن و فەرمانی کردوە هەندێ جار بە پێ خاوسی بڕۆن بەڕێدا. دەستی بەسەری منداڵاندا دەهێناو ناوی دەنان و سـەردانی دەکردن و سڵاوی لێدەکردن ودوعای خێری بۆدەکردن، لە ماڵیشــەوە وەکو کەســێکی ئاســایی وابووەو جلی خۆی دەشــت و دەدوریەوەو مەڕی دەدۆشی و خزمەتی خۆی وکەس وکاری دەکرد، بەڵام کە کاتی نوێژ دەهات دەردەچوو بۆ نوێژەکەی. وە سەردانی هەژارو نەخۆشی دەکرد و بەشداری جەنازەیان دەبوو.



## نمونەیەك لە شەونوێژو عیبادەتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەنوست دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی و دەپاڕایەوە. وە پێش خەوتن ناوی خوای گەورەی دەهێناو سوپاسی دەکرد، وەسورەتی (الخلاص) و (الفلق) و (الناس)ی دەخوێند. بە شەو لەسەر لای ڕاست دەخەوت و پێش نوێژی بەیانیان قۆلی ڕاستی دادەچەقاند و سەری دەخستە سەر لەپی دەستی ڕاستی. سەرەتای شەو دەنوست و کۆتایی یەکەی بە خواپەرستی زیندوو دەکردووە. کە گوێی لە خوێندنی کەڵەشێر دەبوو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ، هەندێ جار بە نەعلەوە نوێژی کردووە. لە کاتی زۆر خەفەت و نارەحەتیدا نوێژی دەکرد. وە فەرموویەتی: وەك من نوێژ بکەن. پەنجەی شایەتمانی لە تەحیاتدا دەجوڵاندو فەرمویەتی: لەسەر شەیطان توندترە لە ئاسن.

ئەوندە شەو نوێژی دەکرد قاچە پیرۆزەکانی ئاوساو قلیشان، وە سەرەتایی شەو دەنوست و ناوەڕاستی شەوو پارشێو هەڵدەستا تا دەچوو بۆ نوێژی بەیانی، وە کە لە شەودا هەڵدەستا (دە) ئایەتی

کۆتـایی ســـورەتی (آل عمران)ی دەخوێنـد. وە ســـیانزە ڕکـات شــەونوێژی دەکرد بەڵام ئەگەر نەیتوانیایە بەشــەو هەســتێ ئەوا ڕۆژەکەی دوانزە ڕکاتی دەکرد. هەندێ جار لە شــەودا نۆ ڕکاتی دەکرد. لە ڕەمەزانیشـدا یانزە ڕکاتی دەکرد. هەندێك جار نوێژەکەی درێژ دەکردەوەو قورئانی زۆر تێدا دەخوێندەوە. وە هەندێ جار بە یەك ئایەت شەوێك شەو نوێژی کردووە. بەڵام لە کۆتایی تەمەنی دا زۆرجار بە دانیشــتنەوە نوێژی دەکرد. وە نوێژی ســـوننەتی زۆری دەکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکات. یان زیاترو شـەش یان تا هەشت ڕکات نوێژی چێشت هەنگاوی دەکرد .

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژوی ســـوننەتی زۆردەگرت و هەندێ جـار زۆربەی مـانگەکەی دەگرت، بەڵام جگە لە ڕەمەزان هیچ مانگێکی سـەراپا نەگرتووە. لەو مانگانەش کە دەیگرتن و زۆر تیایدا بە ڕۆژوو دەبوو وەك: مانگی شەعبان . وە سێ ڕۆژی لە سەرەتای هەموو مانگێکدا دەگرت وە دووشـەممە و پێنج شـەممان، سێ ڕۆژیشی لە هەموو مانگێك دەگرت .وە ڕۆژی (عاشـــورا)یش کە دەکاتە (١٠)ی مانگی موحەڕڕەم. حەزی لە بەردوام بوون بووە لەســـەر کاری خێرو چاکەو ئەوەی پێی خۆش بووە.

پێغەمبەری خوشـــەویست ﴿ﷺ﴾ لە کاتی قورئان خوێندندا ئایەتەکانی درێژ دەکردەوەو لە کۆتایی هەموو ئایەتێکدا دەوەســـتا، وەهەندێ جار دەنگی نزم و کزو هەندێك جاری تر دەنگی هەڵدەبڕی. یان بە مامناوەندی دەیخوێند، لەگەڵ مانای ئایەتەکانیشـــدا ڕۆحی ئاوێتەو تێکەڵاو دەبوو وە دڵی دەدایە، بەڵام لە کەمتر لە سێ ڕۆژدا هەموو قورئانی نەدەخوێندەوە. وە فەرموویەتی: دەنگتان خۆش بکەن بە قورئان خوێندن.

پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ لە ترسی خوای گەورە لە نوێژدا زۆر دەگریا، وە کاتێ گوێی لە قورئان دەگرت. وە لە کاتی نوێژی خۆرگیراندا. وە لە کاتی مردنی کچەکەی و کچەزاکەی دا زۆر گریا. هەروەها لە کاتی وەفاتی هاوەڵێکی خۆشەویستی خۆی دا دەگریا.



## هەندێك لە ئاكار و ڕەوشتە بەرزەكانی

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەسەر گەورەترین ئاكارو رەوشت بووە، لە كاتی قسەكردندا ڕووی دەكردە خراپترینی خەڵكیش تا دڵیان ڕابكێشێ. سەرزەنشتی كەسی نەدەكرد لەسەر شتی دونیایی و جوانترین ڕەوشتی هەبووە، كردەوە ناشرین و دەم پیس نەبووە و لە بازاڕو شوێنی قەرەباڵغدا دەنگی بەرز نەدەكردەوە و بە خراپە وەڵامی خراپەی نەدەدایەوە، بەڵكو لێی دەبوورا. لە كەسی نەداوە، نە لە خزمەتكارو نە لەخێزانەكانی، مەگەر لە كاتی جیهاد كردندا لە پێناوی خوای گەورەدا لە خەڵكی دابێ. وە هەرگیز لەسەر خۆی تۆڵەی لە كەس نەدەسەندەوە، بەڵام ئەگەر بیبینایە سنوورێكی خوای گەورە پێشێل دەكرێ، ئەوكاتە لە هەموو كەس زیاتر توڕە دەبوو. ئەگەر سەرپشك بكرایە بۆ كردنی دووكار ئەوا ئاسانەكەیانی هەڵدەبژارد بە مەرجێ تاوان و گوناه نەبوایە.

زیكرو یادی خوای گەورەی زۆر دەكردو قسەی بێ هەدەری نەدەكردو خۆی بە گەورە نەدەزانی و لەگەڵ بێوەژن و هەژارو

کەنیزە کدا دەڕۆیشت بە ڕێگادا. وە لۆمەو سەرزەنشتی خزمەتکاری نەدەکرد. باڵی سۆزی ڕادەخست بۆ ئیماندااران، کەسیان لێ دوورنەدەخستەوە تابچێتە خزمەتی، وە لە سەفەردا خێرا نەدەڕۆیشت تا لاوازەکان بە کەس و کاریان بگەنەوە. داوای هەرچی لێکرابێ نەیفەرمووە (نەخێر)، گەر هەبوبێ داویەتی یان بێدەنگ بووە. قسەخۆش و دەم بە خەندە بووە لەگەڵ خێزانەکانیداو سوبعەت و یاری لەگەڵ کردون. لەگەڵ تاوانبارو خراپەکاراندا نەرم بووە تا موسڵمان بىن. زۆر ڕقی لە درۆ کردن بووە. جوانترین ڕەنگ بە لایەوە ڕەنگی سەوز بووە. پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ مامۆستای مرۆڤایەتی بووە لەگەڵ خەڵکدا زۆر نەرم بووە. تەنانەت ئەگەر خراپەشی لەگەڵا بکردایە زۆر بە نەرمی وەڵامی دەدایەوە. وە بەرامبەر نەفامێتی خەڵکیش زۆر بە ئارام و دەروون فراوان بووە.

ناوی ناشیرین و ناشیاوی خەڵکی دەگۆڕی، لە کاتی ڕۆیشتندا هاوەڵەکان لەبەردەمی یەوە دەڕۆیشتن و پشتەوەیان جێ دەهێشت بۆ مەلائیکەت . هەرگیز تەوقەی لەگەڵ ئافرەتاندا نەدەکرد، کە دەچوو بۆ سەردانی کەسێك ڕووەو دەرگاکە نەدەوەستا بەڵکو لەلایەکی یەوە ڕادەوەستا، وەدەستی ڕاستی زۆر بەکاردەهێنا. کاتێ هەواڵێکی خۆشیان بۆ بهێنایە سەجدەی شوکری دەبرد بۆ خوای

گەورە، لە کاتی پژمین دا بەدەستی یان کراسەکەی دەم و چاوی دادەپۆشی و دەنگی پێ نزم دەکردەوە، وە حەزی لەپاك و خاوێنی و پۆشاکی جوان بووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەبەزەیی بووە، بە تایبەت لەگەڵ کەس و کارو نەوەکانی دا بە جۆرێ ماچی کچەزاکانی خۆی دەکرد، نەك هەر لەگەڵ مرۆڤدا بەڵکو زۆر بەبەزەیی بووە لەگەڵ گیانلەبەرانیشدا، بە جۆرێك جامی ئاوی لار دەکردەوە بۆ پشیلە تاڵیی بخواتەوەو بە پاشماوەکەشی دەست نوێژی شتووە. وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دادپەروەر بووە لە کاروبارەکانی داو خوای گەورە بەمە فەرمانی پێ کردووە، وە زۆر دڵ سەخاوەت و بەخشندە بووەو هەرگیز بەخیل نەبووە.

خوای گەورە زۆرێك لە موعجیزاتی پێبەخشی بوو: گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوای گەورە پێی بەخشیوە قورئانە، هەروەها زۆر موعجیزەی تری هەبووە وەکو: لەت بوونی مانگ و شەوڕەوی و بڵندبوونەوەی (الإسرآء والمعراج) و بینینی هەموو ئەو شتانە لەو کاتە کەمەدا، وە بەرەکەت کەوتنە خواردنەوە بە ویستی خوای گەورە وەکو لە خەندەق دا (١٤٠٠) هاوەڵ لە یەك

چیتریان خوارد ، وە (١٣٠) کەس لەیەك جگەریان خوارد لە شوێنێکی تردا، وە خواردن لە بەردەمیا تەسبیحاتی دەکردو هاوەڵان دەیان بیست، و لە تەبوکدا ئاو لە نێوان پەنجەکانیەوە دەهاتە دەر کاتێ دەستی خستە ناو جامە ئاوەکەوە بەجۆرێ (٣٠) هەزار کەس لە گەڵ (١٠) هەزار وشتر لێیان خواردەوەو شتیان لێ پڕ کرد. وە لە حودەیبیەدا تیرێکی خستە ناو بیرێکی وشك بوو(بسم الله)ی کرد ئاوەکە پڕبوو تا (١٤٠٠) صەحابە لێیان خواردەوە بۆ ماوەی (١٥) ڕۆژ و هەرمایەوە، وە بەردێك هەبوو سڵاوی لێدەکرد لە کاتی پێغەمبەرایەتی دا، گیان لەبەرانیش شکاتی حاڵیان دەهێنایە لای و دارو درەخت بە تاسەوە بوون بۆی و سێبەرو پەردەیان بۆ دەکرد، وە قەدە دارخورمایەك هەبوو لەلای دا وتاری دەدا، دوای ئەوەی چووە سەر مینبەر ئەو بنە دارە وەك منداڵ دەگریا تا باوەشی پیا کردو ئینجا بێ دەنگ بوو. وە تورەکە خورمایەکی دا بە أبو هورەیرەو فەرمووی: مەیکەرەوە و دەستی پیا بکەو لێی بخۆ، ئەوەبوو تا سەردەمی دوای کوژرانی عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێت) تیایدا مابوو بێ خراپ بوون هەتا توورەکەکە پووا بوو هەڵتەقی. وە چەندان موعجیزەی تر کە لێرەدا جێگەی نابێتەوە.

ئەم پێغەمبەرە خۆشـــەویستە ﴿ﷺ﴾ خوای گەورە بەهۆیەوە چاوانی کوێرو گوێیانی کەڕو دڵانی داخراوی پێکردەوە، وە نێردرابوو تا ڕەوشتە جوانەکان بچەسپێنیت و تەواوی بکات، لەگەڵ ئەوەی کە ئازاری کەسی نەداوە کەچی دوعای دەکرد کە قسەی بە هەرکەسێك ووتووە خوای گەورە بۆ ئەو کەسە بکاتە پاداشت و نزیك بوونەوە لە خۆی.

بە کورتی ڕەوشـــتی قورئـانی بووە، ئەمەنـدە ئـازا بووە لە کـاتی غەزاکاندا لەپێشـــی هاوەڵـــەکانەوە دەجـــەنگا. وە راستەوخۆ لە کارە ســـەختەکاندا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بووە (نەك تەنها بەردی بناغە دابنێـت و بەس!!)، زۆر ڕۆح ســـووك بووە، بە جۆرێـك هەرگیز باوێشکی نەداوە.

وە داوای هەرچی یەکی لێ بکرایە نەیدەوت نی یەو نەخێر زۆر ســـەخی دەروون بووە. بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزان دا. وە بۆ خۆی هیچی هەڵنەدەگرت بۆ سـبەینێ بەڵام خواردنی سـاڵێکی پاشـکەوت دەکرد بۆ کەس و کارەکەی. وەدیاری وەردەگرت و پاداشتی دەدایەوە لەسەری بەڵام خێرو سەدەقەی نەدەخوارد.

شـــەرمی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زیاتر بووە لەشـــەرمی ئەو کچە عـازەبەی کە دەچێتە پشـت پەردەکەیەوە. وە ئەگەر شـــتێکی پێ ناخۆش بوایە بەڕووی دا دەردەکەوت، وە کە دڵخۆش دەبوو ڕووی وەك لەتە مانگ دەدرەوشـــایەوە. لە هەموو کەس ئازاترو ســـەخی تر بووە. پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کەڵەشـــاخی گرتووەو(أبو طَيبه) بۆی کردو ئەویش لە بری دا دوو(صاع) خواردنی دایە (کە هەر صاعێك نزیکەی چوارمشـت دە گرێت). وە دەیفەرموو: چاکترین دەرمانە. وە لەسەر هەردوو لای ملی وە لە نێوان هەردوو شانی و لەسەر سەرەوەی پشتی و ناوشـــانی دا گرتوویەتی. وە لەســـەر پشتی قاچیدا کردویەتی لەبەر ئازارێك کە تیـایدابوو، وەلە (١٧و١٩و٢١)ی مـانگدا دەیگرت (واتە مانگی کۆچی).

ســـیانزە ســـاڵ لە شـــاری مەککە مایەوە وەحی بۆ دەهات و دە ساڵیش لە مەدینەو لە تەمەنی شـەسـت و سێ سـاڵیدا وەفاتی کرد. پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەو ڕۆژەی کە تیـایـدا وەفـاتی کرد پەردەی ژوورەکەی لاداو کۆتا تەماشا تەماشای هاوەڵەکانی کرد کە أبوبەکری صـدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) پێش نوێژی بۆ دەکردن. وە لە کاتی ســـەرەمەرگـدا دەســـتی دەخســـتە ناو ئاوەوەو دەهێنا بەڕوویداو

دەپاڕایەوەو زۆر نارەحەت بوو. لەبەر سـینگ و بەرۆکی عائیشـەدا (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو کە وەفاتی کرد. ئەوەندە نارەحەت دەبوو فاطمەی کچی دەیفەرموو: (وأكرباة) یان (وا كرب أبتاه) واته: ئای بـاوکم چەنـد نـاڕەحەتە. ئەویش دەیفەرموو: ئیتر لەمڕۆ بەدواوە باوکت نارەحەتی توش نابێ و باوکت شـتێکی پێ گەیووە (کە مردنە) کەس ڕزگاری نابێ لێی. وە ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێ بێت) دوای وەفـات کردنی پێغەمبەر ﷺ نـاو چاوی مـاچ کرد و هەردوو قۆڵی گرت و فەرمووی: (وانبیاه، وا صفیاه، وا خلیلاه).

وە بەر لە وەفات کردنی خوای گەورە شوێنی خۆی نیشانداوە لە بەهەشـتداو سـەرپشکی کردبوو کە ئایا ژیانی دونیـای دەوێ یان گەڕانەوە بۆ لای خۆی و پاداشتی نەبڕاوە، ئەویش دووەمی هەڵبژارد. سا ئیتر دوای وەفات کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە بەلای هاوەڵانەوە زۆر ناخۆش بوو. بەجۆرێك شاری مەدینەیان لەلا تاریك بوو. دوای ناشـتن و بە خاك سـپاردنی ڕقیان لەدڵی خۆیان دەبووەوە. وە لە ڕۆژی دووشـەممەی سـاڵی (١١)ی کۆچی دا وەفاتی کرد دوای ئەوەی پەیامەکەی ڕاگەیاندو خوای گەورە دینەکەی خۆی پێ تەواو کرد. وە لە کاتی ناشتنی دا جیاوازی کەوتە نێوان هاوەڵانەوە کە ئاخۆ





لە کوێـدا بینێژن، تـا ئەوە بوو ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێـت) چارەسەری گرفتەکەی کرد و فەرمانی کرد لە شوێنی وەفات کردنی دا بینێژن. وەشـەوی چوارشـەممە لە کۆتایی شـەودا بە خاکیان سـپارد. واتە دووشەو بەم شێوە مایەوەو وەستان لە بەخاك سپاردنی، ئەویش لەبەر دیاری کردنی جێنشـــینێك لەدوای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە ئەویش ئەبو بەکری صـــدیق بوو (ڕەزای خوای لێ بێت). وە لە پێش وەفـات کردنی دا چەنـد جاریـك بووڕایەوەو کە هۆشی دەهـاتەوە دەیفەرموو: با بیلال بانگ بدات وئەبوبەکر بەرنوێژی بکات، دوای وەفات کردنیشـــــــــی هاوەڵەکان زۆر بێ تاقەت بوون کاتێ هەواڵی وەفات کردنیان بیســـت، بەجۆرێ عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) هەڕەشـــەی دەکرد لەو کەســـەی کە بڵێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ مردووە، پاشـــان ئەبوبکر (ڕەزای خوای لێ بێت) هات و تێی گەیاندن کە وەفاتی کردووەو فێری کردن کە بە چ شـێوازێك نوێژی لەسـەربکەن و لە کوێدا بینێژن و کێ بیشـــوات. پاشـــان بەیعەتیاندا بە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت)، وە کرا بە خەلیفە .

پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ جگە لەمـانە هیچی لە دوای خۆی جێ نەهێشـــت: چەکەکەی، وە هێســـترەکەی و پارچە زەوی یەك کە

کردبوووی بە خێر. وە هیچ میراتی یەکی جیٚ نەهێشت بۆ منداڵەکانی بەڵام هەندێکی جیٚ هێشت بۆ نەفەقەی خێزانەکانی، بەڵام ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لیٚ بێت) بەڵێنی دا کە نەفەقەیان بکێشیٚ. وە هیچ مەڕو ماڵاتی دوای خۆی جیٚ نەهێشت.



## خەون بینین پێوەی

هەر کەسێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا ببینێت لەسەر ئەو وەسفانەی کە باسکرا ئەوە ئەوی بینیووە چونکە شەیطان ناتوانیٚ بچێتە شێوەیەوە. وە لە کۆن و نوێدا پیاوچاکان هەبوون کە لە خەودابینیویانەو وا وەسفیان کردووە کە لە شێوەی دا زۆر لەحەسەنی کوڕی ئیمام عەلی چووە (ڕەزای خوای لیٚ بێت).





## ئەو مافانەی لەسەرمانە بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾



١- ئیمان و بڕوا پێ بوونی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾﴾ الأعراف: ١٥٨

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بڵێ: ئەی خەڵکینە چاك بزانن کە من پەیامبەرو نێردراوی خوام بۆ لای سەرجەم ئێوە، ڕەوانەکراوم لە لایەن ئەو خوایەی کە دەستەڵاتداریێتی تەواوی ئاسمانەکان و زەوی تەنها هی ئەوەو جگە لەو هیچ پەرستراوێکی بە هەق نی یە، ژیان دەبەخشێو گیان دەستێنێ، دەسا ئێوەش بە خواو ئەو پەیامبەرە ﴿ﷺ﴾ هەواڵدەرە نەخوێندەوارەی خوا بڕوا بکەن کە ئەو بۆ خۆی بڕوای کاملێ بە خواو بە هەموو ووشەکانی ئەو هەیە، دەسا ئێوەش شوێنی بکەون تا بەڵکو بەختەوەرو شارەزای ڕێگای هەق بن.

یەکەمین مافی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەسەر ئوممەتەکەیەوە ئەوەیە کە بەدڵ و دەروونەوە بڕوامان پێی هەبێت کە لەلایەن خواوە

هەڵبژێردراوەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ خەڵات کراوە، وە بڕوامان وابێت کە ئەو زاتە چاکترین و تەواوترین و راسترین رابەرو پێشەوایە لەسەرجەم بوارە کانی ژیاندا وە هەرچی فەرمووە راست و رەوایەو لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە. وەسوپاسی خوای گەورە بکەین لەسەر رەوانەکردنی ئەو پێغەمبەرە بەرێزە ﴿ﷺ﴾چونکە رەحمەت و نیعمەت بووە بۆ مرۆڤایەتی.

٢- ناسین و شارەزا بوون لە ژیان و سیرەتی پیرۆزی، ئەویش بە خوێندنەوەو موتالا کردن و لێکۆڵینەوە و ڕامان لە ڕەوشت و مامەڵەی لەگەڵ دۆست و دوژمنانی دا، چونکە تا زیاتر لە ژیانی شارەزا بین زۆرتر شیرینایی و خۆشەویستی پێغەمبەری خوامان ﴿ﷺ﴾ لە لا زیاتر دەبێت، ئەو کتێبانەش کە تایبەتن بە سیرەتی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ زۆرن لەوانە: (ژیانی پێغەمبەری مەزن﴿ﷺ﴾)ی پارەزانی، (گوڵاوی سەرمۆر)ی پارێزەر بکر حمه صدیق، (ژیانی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾)مامۆستا محمد ملا فائق، (ژیانی ئازیزمان ﴿ﷺ﴾)مامۆستا حبیب محمد سعید)، .......وە دەیان و سەدان نامیلکەو پەرتووکی کوردی و عەرەبی تر...

٣- خۆشـەویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زیاتر لە ماڵ و منداڵ و کەس و کارو سـامان و خودی خۆشمان، وەسـەرخسـتنی و پارێزگاری کردن لە ڕێزو حورمەتی و بوار نەدان بە هیچ کەسـێك لە ژێر هەر ناوو پاسـاوێکدا بێت بێ ڕێزی بکات بەرامبەری، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ ﴾ الأحزاب: ٦

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێـت: ((لا يؤمن أحـدكم حتى أكون أحب اليه من والده وولده والناس أجمعين)) متفق عليه.

واتە: هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێت هەتا من لە باوك و منداڵ و هەموو کەسێکی خۆشەویستر نەبم.

وە هەر لە خۆشەویستی ئەویشە خۆشویستنی خێزانە سەنگین و نموونەیی یەکانی و هـاوەڵە گیانفیداو ناوازەکانی (ڕەزای خوایان لێ بێت)..

٤- شـوێنکەوتنی ڕێبـازەکەی و گوێڕایەڵی کردن و جێبەجێ کردنی فەرمـایشتەکـانی، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشـەنگی ئێمەیە وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ٢١ ﴾ الأحزاب: ٢١

وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێت: ((... فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشيدين المهديين..)).

واتە: دەستبگرن بە سوننەتی من و سوننەتی جێ نشینە ڕێنمویی کراوە کانم.

وە بانگەشەکردنی خۆشەویستی بەبێ گوێڕایەڵی کردن هیچ بەهایەکی نی یە.

٥- خۆشویستنی دۆستانی و بوغزاندنی دوژمنانی: چونکە بە گشتی خەڵکی دوو جۆرن: یان دۆست و لایەنگری دینی خوان و پێغەمبەری خوایان ﷺ بە پێغەمبەرو پێشەوا قبوڵەو خۆشیان دەوێت، یان بە پێچەوانەوە لە بەرەی نەیاران و دوژمنانی دیندان و هەموو هەوڵ و تەقەلایان بۆ ناشیرین کردنی ئیسلام و پیرۆزی یەکانێتی. خوای گەورەش دەفەرموێت قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ ..... ﴾ الفتح: ٢٩

٦- کارکردن بە سوننەتەکانی و خۆڕازاندنەوە بە ئاکارو ڕەوشتەکانی: پێغەمبەری سەرکردەو ڕابەر ﷺ تەنها لە بواری پەرستش و خواپەرستی دا پێشەنگ نەبووەو بەس، بەڵکو سەراپای تەمەنی زێڕینی پڕ گەوهەری لێواو لێوە لە ئاکارو ڕەوشت و مامەڵەی

هەنگوین ئاسای، بەڵام زۆر بە کەمی ئاگامان لەو ڕەوشتانەیەتی و زۆر بە کەمیتریش جێبەجێی دەکەین و خۆمان بەو ڕەوشتانەی ئەو ئارایشت دەکەین، بۆیە موسڵمانی یەتەکەمان تەنها رەمزو ناونیشانەو جەوهەرو رۆحی تیانیەو نەمانتوانیوە ببینە نمونەی زیندوو بۆ بنەما ڕەوشتی یە جوان و چەسپاوەکانی ئیسلام تا خەڵکی بانگەواز بکەین.

٧-بە بەردەوامی سەڵاوات دان لەسەری و سەلام ناردن بۆی: بە تایبەتی هەرکاتێك ناومان برد یان ناویمان بیست، کە ئەمەش فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﴿ﷺ﴾ بۆمان، وە مایەی ریٚ لیٚ وون نەبوونی بەهەشتە.

٨- بڵاوکردنەوەی دینەکەی و خۆفیداکاری بە ماڵ و گیان بۆ گەیاندن و برەودان بە رێبازەکەی، وەك هاوەڵان کاتیٚ لە رۆژی (ئوحد)دا پڕوپاگەندەی شەهید بوونی پێغەمبەریان ﴿ﷺ﴾ بیست دەیانفەرموو: ((قوموا فموتوا على مامات عليه رسول الله)). وە هەوڵدان و شەونخونی کردن بۆ ئاشناکردنی چینێکی زیاتر بەم ڕەوشت و ئاکارانەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾کە بە دڵنیایی یەوە هەرکەس بە ئینسافەوە لێی شارەزا بێت و خوای گەورە ویستی

هیدایەتی بۆی هەبێت زۆر گەرم و توندو تۆڵا تر لەوانەی بانگیان کردووە دەبێتە خوێندکاری ناو ئەم زانکۆ گەورە پڕ لە سەروەری یە.

زۆر جار بە مەبەستی خۆشەویستی دەربڕینەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی رَبِيعُ الأَوَّل دا شیرینی دەبەخشرێتەوەو شادی دەردەبڕێت، بەڵام ئەم کارە لە سۆنگەی شەرعەوە دروست نی یە، چونکە رێزگرتن و خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەت نی یە بە رۆژو مانگێکی دیاری کراوی ساڵ و بەس، پاشان ئەم یادە هاوەڵانی یەکەم خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ نەیانکردووەو خۆمان دروستمان کردووە!! جا لە جیاتی سەرفکردنی ئەو بڕە پارەیە لەو شادی و مەولود سازکردنە کاتی یەدا با هەوڵ بدەین لە بڵاوکردنەوەی ئاکارو ڕەوشت و رێبازو بەرنامەکەیدا سەرفی بکەین و لەو سەدەقە جاری یەدا دایبنێین، وە خۆمان و ماڵ و منداڵ و کەسوکارمان بڕازێنینەوە بە ڕەوشت و ئاکارو عیبادەت و سوننەتەکانی تا بەڵکو بە پشتیوانی خوای گەورە کۆمەڵگایەکی پڕ لە عیزەت لە ژێر سایەی بەرنامەو ئاکاری پێغەمبەری یانەدا دروست ببێت.... وما ذلك على الله بعزيز.



خوای گەورە ئەم کارە بچوکەشمان بە عیبادەت و (صــەدەقەی جاریە) بۆ حیساب بکات و پاداشتی هەموو ئەو کەسانەش بداتەوە کە بەشداربوون لە خێری بڵاوکردنەوەی دا.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**



إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ
يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ
يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا
صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا
تَسْلِيماً

ئامادەکردنی: حەمزە بەرزنجی